بەڵام زانایان دەڵێن ئەوانەی کە بەتوانان لەگەڵ نەخۆش و ئافرەت و پەککەوتەکان دان، هیچ ڕوخسەتێك نییە بۆیان کە ڕەجمی (جمرە العقبة) بکەن پێش خۆر کەوتن، ئەو ڕوخسەتە بەس بۆ کەسانی خاوەن ڕوخسەتن.

بەگوێرەی ئەو ڕیوایەتانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە عبدالله ی کوڕی عباسی فەرمووە کە لەگەڵ پەککەوتەکان دا ڕۆشتووە.

بەهێزترین ڕای زانایان ئەو ڕایەیە کە دەڵێن دەبێت دوای نوێژی بەیانی ڕەجمی (العقبة) بکەن کەسانی خاوەن ڕوخسەت.

● پاش ڕەجم کرجنی (العقبة) نەوەستێت بۆ دووعاکردن.

عن جابر رضي الله عنه رضي الله عنه: «رَمَى مِنْ بَطْنِ الْوَادِي، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى الْمَنْحَرِ». مسلم (١٢١٨).

واتە: جابر دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەجمی (العقبة) کرد نەوەستا بەرەو شوێنی سەربڕینی ئاژەڵ کەوتە ڕێ.

* لەدوای ڕەجم کردنی (جمرة العقبة) هەموو شتێك بۆ حاجی حەڵاڵ دەبێت بێجگە لە ئافرەتان، بۆی هەیە ئیحرام لابدات و جل و بەرگی خۆی لەبەر بکات، وە هەندێك لە زانایان دەڵێن دەبێت سەرتاشینیشی

لەگەڵ بێت ئەوکاتە دەتوانێت ئیحرام لابدات بە بەڵگەی «إذا رميتم وذبحتم وحلقتم حل لكم كل شيء إلا النساء».ضعيف في الضعيفة (١٠١٣)، وحجة النبي ﷺ ص٨١.

بەڵکو بە ڕەجم کردنی (جمرة العقبة) حەڵاڵ بوونی یەکەم بەدەست دەهێنێت (التحلل الأول) بەم بەڵگانە:

١. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: «طَيَّبْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِيَدَيَّ هَاتَيْنِ، حِينَ أَحْرَمَ، وَلِحِلِّهِ حِينَ أَحَلَّ قَبْلَ أَنْ يَطُوف».البخاري (١٧٥٤)، ومسلم (١١٨٩).

واتە: عائیشە دەفەرموێت: بۆنی خۆشم دەکرد بە پێغەمبەردا ﷺ پێش لەبەرکردنی ئیحرام و پاش لابردنی ئیحرام پێش ئەوەی تەوافی (الإفاضة) بکات، بەکارهێنانی بۆنی خۆش مانای لابردنی ئیحرامە.

٢. عن إبن عباس و عائشة رضي الله عنهما قال رسول الله ﷺ: «إذا رميتم الجمرة فقد حل لكم كل شيء إلا النساء».صحيح أبي داود (١٩٧٨)، وصحيح إبن ماجة (٢٤٦٦)، الصحيحة (٢٣٩).

واتە: ئەگەر (جمرة العقبة) تان ڕەجم کرد ئەوا هەموو شتێکتان لەسەر حەڵاڵ دەبێت بێجگە لە ئافرەتان (خێزانیان).

## ٢. سەربڕینی ئاژەڵ:

قال تعالى: ﴿هَدۡيَۢا بَٰلِغَ ٱلۡكَعۡبَةِ﴾ [المائدة: ٩٥]. واته: هەدیەو بەخشینێکە بۆ هەژارانی ماڵی خوا بۆیە زانایان ناویان بردووە بە سەربڕینی سوپاس گوزاری بۆ خوا کە حەجەکەی ئەنجام داوە (دم الشكران) یاخود هەدیەو قوربانی یەکی واجبە بۆ میوانانی ماڵی خوا.

ئەمە (فدية) و پڕکردنەوەی ناتەواوی حەج نیە، لەبەر ئەوەی حاجی هیچ ناتەواوی یەکی ئەنجام نەداوە، کە حەجەکەی بە (التمتع) کردووە، کە عەمرەی لە حەج جیاکردۆتەوە و ئیحرامی لابردووە، بەڵکو هەمان قوربانی و سەربڕینی ئاژەڵ واجبە بۆ حەجی (قيران) کە حاجی ئیحرامی لانەبردووە لەنێوان عومرەو حەجەکەی دا، ئەمیش لەسەری واجبە وەکو (التمتع).

وە ئەگەر (فدية) بێت ئەوا لەسەر ڕای زانایان نابێت لێی بخوات، لەگەڵ ئەوەش دا فەرمانی خواو کاری پێغەمبەرەکەی خواردن و بەخشینەوەیە ﴿فَكُلُواْ مِنۡهَا...﴾ [الحج: ٢٨و٣٦] . و رواية جابر ((كلوا وتزودوا....)). و ((فأكلا من لحمها وشربا من مرقها)).مسلم (١٢١٨).

پێویستە بەم شێوەیە سەربڕین ئەنجام بدات گەر خۆی سەری بڕی یاخود وەکیلەکەی.

١. بەدەستی خۆی سوننەتە گەر توانی سەری ببڕێت:

عَنْ جَابر ﷺ قَال: ((ثُمَ انْصَرَفَ اِلَى المَنْحَرْ فَنَحَرَ ثَلاثاً وَستينَ بَدَنة بيَدهِ...)). أبوداود (١٧٦٤)، وإبن ماجة (٣٠٧٤).

واتە: پێغەمبەر ﷺ بەرەو شوێنی سەربڕینی ئاژەڵ کەوتە ڕێ و لەوێدا شەست و سێ حوشتری بەدەستی خۆی سەربڕی.

٢. ڕووی بکاتە قیبلەو لەسەر لای چەپ ڕای کشێنێت و بلێت: وەك پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

((بِسْمِ الله، الله أَكْبَرْ، اللهُمَ إنَ هَذا مِنْكَ وَلَكَ، اللهُمَ تَقَبَلْ مِني)). مسلم (١٩٦٧).

واتە: بەناوی تۆ خوای پەروەردگار ئەمە لە تۆوەیەو بۆ تۆیە پەروەردگارم لێم وەرگرە.

٣. لێخواردنی و بەخشینەوەی و لێهەڵگرتنی:

قال تعالى: ﴿فَكُلُوا۟ مِنْهَا وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْبَآئِسَ ٱلْفَقِيرَ﴾ [الحج: ٢٨].،﴿فَإِذَا وَجَبَتْ جُنُوبُهَا فَكُلُوا۟ مِنْهَا وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْقَانِعَ وَٱلْمُعْتَرَّ﴾ [الحج: ٣٦].

واتە: لێی بخۆن و بیبەخشن بە هەژاران و ئەوانەی داوای دەکەن وە کەسانی بێ پێویست.

عَنْ جَابر ﵁: «ثُمَّ أَمَرَ مِنْ كُلِّ بَدَنَةٍ بِبَضْعَةٍ، فَجُعِلَتْ فِي قِدْرٍ، فَطُبِخَتْ، فَأَكَلَا مِنْ لَحْمِهَا وَشَرِبَا مِنْ مَرَقِهَا».مسلم (١٢١٨).

واتە: پاش سەربڕینی حوشترەکان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بە (علی کوڕی ئەبو طالب) لەهەموو حوشترێك پارچەیەك بێنێت و لێی بنێت، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ و علی کوڕی ئەبو طالب لە گۆشت و ئاوەکەیان خوارد.

عَنْ جَابِرٍ ﵁، قَالَ رَسولَ الله ﷺ: «كُلوا وَتَزَوَدوا، قَالَ: فَأَكَلْنَا وَ تَزَوَدْنَا حَتَى بَلَغْنَا بِها الَمدينَة».مسلم (١٢١٨)، حجة النبي ﷺ ص٨٥.

واتە: جابر دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بە خواردن و هەڵگرتنی بۆ ڕێگا، لێمان خواردو هەڵمان گرت تا پێی گەیشتینە مەدینە.

- **شوێنی سەربڕینی ئەم هەدیەو قوربانییە دەبێت لە سنوری حەرەم دەرنەچێت، واتە مەککە و مینا.**

**قال تعالى: ﴿ثُمَّ مَحِلُّهَآ إِلَى ٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ﴾ [الحج: ٣٣]، ﴿حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْهَدْىُ مَحِلَّهُۥ﴾ [البقرة: ١٩٦]، ﴿وَٱلْهَدْىَ مَعْكُوفًا أَن يَبْلُغَ مَحِلَّهُۥ﴾ [الفتح: ٢٥].**

**هەموو ئەم ئایەتە پیرۆزانە ئاماژە بە شوێنی سەربڕینی هەدیەکە دەکەن کە (مەککە و سنوری حەرەم)ە.**

**وَعَنْ جابِرٍ ﵁ قَالَ رَسُولَ الله ﷺ: «قَدْ نَحرْتُ هاهُنا وَمَنَى كُلُها مِنْحَرْ».** مسلم (١٢١٨).

**واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی لەدوای قوربانییەکە لەشوێنێك لە مینا، لێرەدا قوربانیم کرد و هەموو سنوری مینا شوێنی قوربانییە.**

**وقال ﷺ: «وَكُلُّ فِجَاجِ مَكَّةَ طَرِيقٌ وَمَنْحَر».** صحيح سنن أبي داود (١٧٠٧)، وصحيح سنن إبن ماجة (٢٤٧٣).

**واتە: هەموو کەککەو شیوو دۆڵ و ڕێگەکانی شوێنی سەربڕینە.**

- **کاتی سەربڕین:**

قال تعالى: ﴿وَيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ فِي أَيَّامٍ مَّعْلُومَاتٍ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّن بَهِيمَةِ الْأَنْعَامِ﴾ [الحج: ٢٨]،﴿وَاذْكُرُوا اللَّهَ فِي أَيَّامٍ مَّعْدُودَاتٍ﴾ [البقرة: ٢٠٣].

واتە: یادو زیکری خوای پەروەردگار بکەن لە ڕۆژانی دیاری کراودا و ناوی پەروەردگار ببەن لەسەر ئەو ئاژەڵانەی دەیکەن بە قوربانی.

* (أيام معدودات) و (أيام معلومات) ڕۆژانی دیاری کراوو ناسراو: هەر چوار ڕۆژەکەی جەژنی قوربانە، قال رسول الله ﷺ: «...كُل أَيام التَشْريقْ ذبح». صحيح الجامع الصغير (٤٥٣٧).

واتە: هەموو ڕۆژانی جەژنی قوربان کاتی سەربڕینە.

وە بەڕێزترین کات ڕۆژی یەکەمی جەژنی قوربانە کە ناونراوە بە ڕۆژی قوربانی (يوم النحر)، وە لە قورئان دا داوای کردووە لەدوای نوێژی جەژن قوربانی بکەن ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ﴾ [الكوثر: ٢]، وَقالَ رَسولَ الله ﷺ: «أَفْضَلُ الأيَامِ عِنْدَ الله يَوْم النَحر...». صحيح إبن حبان (٢٨١١).، وقال ﷺ في حجة الوداع: «أَيُّهَا النَّاسُ – ثَلَاثَ مَرَّاتٍ – أَيُّ

يَوْمٍ هَذَا؟ قَالُوا: يَوْمُ النَّحْرِ يَوْمُ الْحَجِّ الْأَكْبَرِ...)).النسائي (٤١٠٠).، وَعَن عَلي رضي الله عنه سَأَلْتُ رَسول الله ﷺ عَنْ يوم الحَجِ الأكْبَر، فَقالَ: ((يَوْمُ النَحر)).الترمذي (٩٥٧)، صحيح أبي داود (١٧٧٠٠).

واتە: پرسیار کرا وە سێ جار فەرموویەتی (یوم الحج الأکبر) ڕۆژی حەجی گەورە (یوم النحر) یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربانە، کەواتە ئەوانەی قوربانییەکانیان یاخود (هدیة) کانیان دەبەنەوە وڵاتی خۆیان و لە مەککە نایکەن، ئەوە یەکێك لە واجبەکانی حەجییان فەوتاندووە گەر ساڵێکی تریش بێت دەبێت لە مەککە لەو مەراسیمە دا یەکێك ڕابسپێرن بۆیان بکات.

## ٣. سەرتاشین یاخود کورت کردنەوە:

کاری سێهەمی ڕۆژی جەژنی قوربان سەرتاشین یاخود کورت کردنەوەیەتی.

قال تعالى: ﴿لَتَدۡخُلُنَّ ٱلۡمَسۡجِدَ ٱلۡحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمۡ وَمُقَصِّرِينَ﴾ [الفتح: ٢٧].

باشتر وایە پیاوان سەر بتاشن وەك لەوەی کورتی بکەوە.

«يا معمر ألديك موسي؟ قال نعم يا رسول الله ﷺ، قال ﷺ: سمِ الله وأحلق رأسي)).أحمد (٦/٤٤٠٠).

واتە: پێغەمبەر ﷺ بە سەرتاشەکەی فەرموو: ئەی عەمر موست لابە؟ وتی بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی (بسم الله) بکەو سەرم بتاشە.

وَقالَ رَسولَ الله ﷺ: «"اللَّهُمَّ ارْحَمِ الْمُحَلِّقِينَ" قَالُوا: وَالْمُقَصِّرِينَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: "اللَّهُمَّ ارْحَمِ الْمُحَلِّقِينَ" قَالُوا: وَالْمُقَصِّرِينَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: "وَالْمُقَصِّرِينَ"».البخاري (١٧٢٧)، ومسلم (١٣٠١).

واتە: سێ جار پێغەمبەری خوا ﷺ دووعای لێخۆش بوون و بەزەیی کرد بۆ ئەوانەی سەریان دەتاشن و یەك جار دووعای کرد بۆ ئەوانەی کورتی دەکەنەوە.

بەڵام بۆ ئافرەتان کورت کردنەوەیە، قَالَ رَسولَ الله ﷺ: «لَيْسَ عَلَى النِّسَاءِ حَلْقٌ، إِنَّمَا عَلَى النِّسَاءِ التَّقْصِيرِ».صحيح سنن أبي داود (١٧٤٧).

واتە: ئافرەتان تاشینیان لەسەر نییە بەڵکو کورت کردنەوەیان لەسەرە.

# پلەو پاداشتی سەرتاشین

وَقالَ رَسولَ الله ﷺ: «وَأَمَا حَلاقك رَأسَكَ فَلَكَ بِكُلِ شَعرة حَلَقَتْها حَسَنَة وَيَمْحَى عَنْكَ بِها خَطيئَة». صحيح الترغيب (١١٦٠).

واتە: سەرتاشینەکەت بە هەموو تاڵە موویەك چاکەیەکت بۆ دەنوسرێت و تاوانێکی پێ دەسڕدرێتەوە.

وفي رواية: «فإنه ليس من شعرك شعرة تقع في الأرض إلا كانت لك نورا يوم القيامة». صحيح الترغيب (١١٦٠).

واتە: هەموو تاڵە موویەکت کە دەکەوێتە سەر زەوی دەبێت بە نوور و ڕووناکی لە ڕۆژی دوایی دا.

وە بەهیچ شێوەیەك دروست نییە لە بری سەرتاشین سێ تاڵ موو لێبکەیتەوە و یاخود لە هەندێك سەرت بگریت، ئەمە سەرپێچی قورئانە کە بە (جمع) کۆ ناوی دەبات (رؤوسکم) سەرتان، وە سەرپێچی کاری پێغەمبەری خوایە ﷺ کە هەموو سەری تاشیوە.

عَنْ إِبْنُ عُمَرْ رضي الله عنهما: «حلق سول الله صلى الله عليه وسلم في حجته». البخاري (١٧٢٦).

وە ئەگەر کورتی کردەوە دەبێت لەهەموو سەر کورت بکاتەوە، وە ئەو ووتەیەی کە دەڵێت دروستە سێ تاڵ موو کەمتر نەبێت بۆ قژ برین هیچ بەڵگەیەکیان پێ نییە جگە لەوە نەبێت کە دەڵێت لە زمانەوانی دا (اللغة) عەرەبی کەمترین کۆ لە ژمارە سێ وە دەست پێ دەکات، کە ئەمەش خۆی نابێتە بەڵگە بەڵکو بەڵگە فەرموودەی خوای عز وجل و پێغەمبەرە ﷺ وە یاخود کردەوەیەتی، وە پێغەمبەریش ﷺ بەهیچ شێوەیەك فەرمانی بەوە نەداوە و خۆشی و هاوەڵانی ئەو کارەیان نەکردووە کە چەند تاڵە موویەك ببڕن.

ئافرەتانیش گەر پەلکەیان بوو لە هەموو پەلکەیەك بە هەندەی سەرە نینۆکێك ببڕن، یاخود قژیان دابنێن لە هەموو خوارووی قژیان بەو هەندەیە ببڕن.

## ٤. تەوافی (الإفاضة) ماڵی خواو سەعی سەفاو مەروە:

کاری چوارەمی یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان بۆ حاجییان (طواف الإفاضة و سەعی نێوان سەفاو مەروە) یە، واتە تەوافی گەڕانەوە، کە ئەم تەوافە ڕوکنە و باش وایە هەر ئەو ڕۆژە ئەنجانی بدەیت پێش مەغریب، وە پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان دا ئەم تەوافەی

کردووە، گەر نەگونجا هەتا کۆتایی مانگی (ذو الحجة) دەبێت ئەنجامی بدات بەڵام تا نەکردنی حەڵاڵ بوونی دووەمی بەدەست نایەت (التحلل الثاني) کە حەڵاڵ بوونی ئافرەتە.

وقال تعالى: ﴿ثُمَّ لْيَقْضُوا۟ تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُوا۟ نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُوا۟ بِٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ﴾ [الحج: ٢٩].

واتە: پاشان ئەو چڵك و پیسیەی سەفەر لەسەر خۆیان لابەن بە تاشینی سەرو لابردنی ئیحرام وە بە (قوربانی) سەربڕینەکانیان ئەنجام بدەن و تەوافی ماڵەکەی خوا بکەن.

عن عبدالله بن عباس رضي الله عنهما: «لَمْ يَرْمُلْ فِي السَّبْعِ الَّذِي أَفَاضَ فِيه». صحيح سنن أبي داود (١٧٦٢)، وإبن ماجة (٢٤٨٣).

واتە: عبدالله ی کوڕی عباس دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەوت تەوافی (الإفاضة) دا ڕاکرد هەروەڵەی ئەنجام نەداوە.

وە باسی (الإضطباع) شان ڕووت کردنی نەکردووە هەر هەروڵەی باس کردووە لەبەر ئەوەی بە جلی ئاسایی خۆتەوە دەیکەیت و ئیحرام لادەبەیت.

**عن إبن عمر** رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا : **((أن رسول الله صلى الله عليه وسلم أفاض يوم النحر...)).** مسلم (٣١٥٢)، و أبوداود (١٩٩٨).

**واتە: پێغەمبەری خوا** ﷺ **تەوافی (الإفاضة) ی لە یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان دا ئەنجام دا.**

**پاش حەوت تەوافی کەعبە دوو ڕکات نوێژ لە پشت (مقام إبراهیم) وە دەکات و پاشان سەعی نێوان سەفاو مەروە حەوت جار دەکات.**

*** سەعی یاخود تەوافی نێوان سەفاو مەروە بۆ کەسانی کە حەجیان بە (التمتع) کردبێت، واتە عومرەیان بە جیا کردبێت و پاشان حەجیان کردبێت، بەڵام ئەوانەی حەجیان بە (قران) یان (إفراد) کردووە، واتە عومرەو حەجیان پێکەوە کردبێت و لە نێوانیان دا ئیحرامیان لانەبردبێت، یاخود ئیحرامیان بە حەجی تەنیا بەستبێت بەبێ عومرەو بە ئیحرامەوە مابێتەوە تا دوای ڕەجم کردنی (جمرة العقبة).**

**گەر ئەم دوو کەسە لە سەرەتای هاتنیان بۆ کەعبە دوای حەوت تەوافی کەعبە سەعی نێوان سەفاو مەروەیان حەوت جار ئەنجام دابێت، ئەوا لەدوای تەوافی (الإفاضة) پێویست ناکات سەعی نێوان سەفاو**

مەروە بکەن لەبەر ئەوەی بە ئیحرامەوە ماونەتەوە، وە گەر نەیان کردبێت ئەوا دەبێت دوای تەوافی (الإفاضة) بیکەن.

عن عائشة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا : «طَوَافُكِ بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ يَكْفِيكِ لِحَجَّتِكِ وَعُمْرَتِكِ». مسلم (١٢١١)، وأبوداود (١٨٩٧).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بە عائیشەی خێزانی فەرموو: تەوافی کەعبەو سەعی نێوان سەفاو مەروەت یەك جار بەسە بۆ حەج و عومرەکەت.

وعن جابر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: «لَمْ يَطُفِ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَا أَصْحَابُهُ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ إِلَّا طَوَافًا وَاحِدًا» زَادَ فِي حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ بَكْرٍ: «طَوَافَهُ الْأَوَّل». مسلم (٣٠٧٤).

واتە: جابر دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی تەوافی نێوان سەفاو مەروەیان یەك جار ئەنجام دا ئەویش یەکەم جار کە هاتنە مەککە و دوای تەوافی کەعبە، واتە بۆ دووەم جار کە تەوافی (الإفاضة) یان ئەنجام دا سەعی سەفاو مەروەیان نەکرد لەبەر ئەوەی ئیحرامیان بە حەج و عومرەی پێکەوە بەستراو (القران) کرد.

* لەدوای ئەنجام دانی تەوافی (الإفاضة) خێزانی بۆ حەڵاڵ دەبێت و لە هەموو قەدەغە کراوەکانی ئیحرام دەردەچێت و پێی دەڵێن (التحلل الثاني) حەڵاڵ بوونی دووەم و کۆتایی.

* ئەگەر ئافرەتان کەوتنە سوڕی مانگانەوە پێش تەوافی (الإفاضة)، دەبێت هەتا ئەتوانن بمێننەوە تاوەکو ئەو حەوت تەوافە بە پاکی ئەنجام بدەن لەبەر ئەوەی ڕوکنێکی حەجە.

بەڵام ئەگەر بۆیان نەکرا بەهۆی کاتی دیاری کراوی گەڕانەوەی قافڵەکەو و هێشتا ئەو پاکی بەدەست نەهێناوە، وە ناشکرێت بە تەنیا بمێنێتەوە و دوا بکەوێت، ئەوا زانایان ڕێگەیان داوە تەوافی (الإفاضة) ئەنجام بدەن، وە لەم حاڵەتەدا (طواف الوداع)ی لەسەر نییە.

عن عائشة رضي الله عنها : «أَنَّ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيّ –زَوْجَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ– حَاضَتْ فِي أَيَّامِ مِنًى، فَقَالَ: «أَحَابِسَتُنَا هِيَ؟»، قَالُوا: إِنَّهَا قَدْ أَفَاضَتْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «فَلاَ إِذًا». البخاري (١٧٣٣)، ومسلم (١٢١١).

واتە: صەفییەی خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەج دا کەوتە سوڕی مانگانەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە ڕێگری کرد لە

ڕۆشتنمان، وتیان تەوافی (الإفاضة) ی کردووە، فەرمووی: کەواتە ڕێگری نییە با بڕۆین.

**عن إبن عباس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: «أن النبي صلى الله عليه وسلم رخص للحائض أن تصدر قبل أن تطوف».** صحيح سنن أبي داود (١٧٤٨).

واتە: عبدالله ی کوڕی عباس دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەی دا بە ئافرەت کە لە سوڕی مانگانەدایە بڕۆن بەبێ تەوافی وەداع کردن.

* ئەم چوار کارەی مەراسیمی حەج لە یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان دا گەر بەو شێوە زنجیرەییەی کە باسمان کرد ئەنجام بدرێت کارێکی تەواوو سوننەتە لەبەر ئەوەی لە قورئان دا بەو شێوە زنجیرەییە بەدوای یەك دا باس کراوە.

قال تعالى: ﴿وَلَا تَحۡلِقُواْ رُءُوسَكُمۡ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ ٱلۡهَدۡيُ مَحِلَّهُۥ﴾ [البقرة: ١٩٦]، ﴿ثُمَّ لۡيَقۡضُواْ تَفَثَهُمۡ وَلۡيُوفُواْ نُذُورَهُمۡ وَلۡيَطَّوَّفُواْ بِٱلۡبَيۡتِ ٱلۡعَتِيقِ﴾ [الحج: ٢٩].

وە هەروەرها پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕیوایەتەکەی جابری کوڕی عبدالله دا بەو شێوەیە باسی چۆنێتی حەجی پێغەمبەری خوای ﷺ

کردووە «...ثُمَّ سَلَكَ الطَّرِيقَ الْوُسْطَى الَّتِي تَخْرُجُ عَلَى الْجَمْرَةِ الْكُبْرَى،...فَرَمَاهَا...ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى الْمَنْحَرِ، فَنَحَرَ ثَلَاثًا وَسِتِّينَ بِيَدِهِ،...ثُمَّ رَكِبَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَفَاضَ إِلَى الْبَيْتِ...». مسلم (١٢١٨).

بەڵام ئەگەر پێش و پاشی بکەوێت، ئەوا ڕێگەی پێ دراوەو هیچ لەسەر خاوەنەکەی ناکەوێت.

عن عبدالله بن عمرو: «وَقَفَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ بِمِنًى لِلنَّاسِ، يَسْأَلُونَهُ،...فَمَا سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ شَيْءٍ قُدِّمَ وَلاَ أُخِّرَ إِلاَّ قَالَ: "افْعَلْ وَلاَ حَرَجَ"». البخاري (٨٣)، ومسلم (٣١٤٣).

وعن إبن عباس رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: «أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قِيلَ لَهُ: فِي الذَّبْحِ، وَالْحَلْقِ، وَالرَّمْيِ، وَالتَّقْدِيمِ، وَالتَّأْخِيرِ، فَقَالَ: "لاَ حَرَجَ"». مسلم (٣١٥١).

واتە: هەرچی لەو ڕۆژەدا پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرا لە پێش و پاش خستنی کارەکانی حەج، دەیفەرموو ڕێگری نییە.

تەنانەت سەعی نێوان سەفاو مەروە پێش تەوافی کەعبە ڕێگەی پێ داوە، عن أسامة بن شريك: «...فَمَنْ قَالَ يَا رَسُوْل الله سَعَيْتُ قَبْلَ أَنْ أَطُوفُ...فَكانَ يَقوْلُ لاَ حَرَجْ لاَ حَرَجْ». أبوداود (٢٠١٥).

* پاشان حاجییان دەبێت بۆ شەوی دووەمی جەژن بگەڕێنەوە بۆ (مینا)، مانەوەی شەو واجبە لە مینا دا.

عن عائشة رضي الله عنها : «أفاضة رسول الله صلى الله عليه وسلم...ثم رجع إلى منى فأقام بها أيام التشريق الثلاث...». صحيح أبي داود (١٩٧٣)، وأحمد (٦/٩٠).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دوای تەوافی (الإفاضة) سێ ڕۆژەی جەژنی لە (مینا) مایەوە.

* هەموو ڕۆژێکی جەژن واجبە ڕەجمی هەرسێ جەمەرات بکات لەدوای بانگی نیوەڕۆ.

عن جابر رضي الله عنه: «رَمَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْجَمْرَةَ يَوْمَ النَّحْرِ ضُحًى، وَأَمَّا بَعْدُ فَإِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ». مسلم (١٢٩٩).

واتە: جابر خوای لێ ڕازی بێت دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ (جمرة العقبة)ی لە یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان چێشتەنگاو ڕەجم کرد

بەڵام سێ ڕۆژەكەی تری جەژن هەرسێ جەمەڕاتی دوای بانگی نیوەڕۆ ڕجم كرد.

## شێوازی ڕەجم كردنی هەرسێ جەمەڕات

عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: «أَنَّهُ كَانَ يَرْمِي الجَمْرَةَ الدُّنْيَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، يُكَبِّرُ عَلَى إِثْرِ كُلِّ حَصَاةٍ، ثُمَّ يَتَقَدَّمُ حَتَّى يُسْهِلَ، فَيَقُومَ مُسْتَقْبِلَ القِبْلَةِ، فَيَقُومُ طَوِيلًا، وَيَدْعُو وَيَرْفَعُ يَدَيْهِ، ثُمَّ يَرْمِي الوُسْطَى، ثُمَّ يَأْخُذُ ذَاتَ الشِّمَالِ فَيَسْتَهِلُ، وَيَقُومُ مُسْتَقْبِلَ القِبْلَةِ، فَيَقُومُ طَوِيلًا، وَيَدْعُو وَيَرْفَعُ يَدَيْهِ، وَيَقُومُ طَوِيلًا، ثُمَّ يَرْمِي جَمْرَةَ ذَاتِ العَقَبَةِ مِنْ بَطْنِ الوَادِي، وَلاَ يَقِفُ عِنْدَهَا، ثُمَّ يَنْصَرِفُ، فَيَقُولُ "هَكَذَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَفْعَلُهُ"». البخاري (١٧٥١).

واته: سالمی كوڕی عبداللە ی كوڕی عومەر دەڵێت: جەمرەی (بچوك) یاخود یەكەمی خستە نێوان خۆی و قیبلەوە و ڕەجمی كرد بە حەوت بەردو لەگەڵ هەموو بەردێك دا (الله أكبر)ی دەكرد، پاشان چووە پێشەوەو بەلای ڕاستی خۆی دا و جەمرەی بچوك كەوتە لای چەپی و لەنێوان هەردوو جەمرە دا ڕووەو (قیبلة) وەستاو دەستی

هەڵبڕی و دوعایەکی زۆری دوورو درێژی کرد.، پاشان ڕووەو (قیبلة) جەمرەی (ناوەڕاست، دووەم)ی ڕەجم کرد بە حەوت بەردو لەنێوان جەمرەی ناوەڕاست و کۆتایی دا بەشێوەیەك کە ناوەڕاستی خستە لای ڕاستی خۆیی و ڕووەو (قیبلة) وەستاو دەستی هەڵبڕی و دوعایەکی دوورو درێژی کردو پاشان جەمرەی گەورە (العقبة)ی ڕەجم کردو بە شێوەیەك کەعبەی خستە لای چەپی و مینا ی خستە لای ڕاستی، پاشان ڕۆی و دوای سێهەم نەوەستا و عبدالله ی کوڕی عومەر فەرمووی (بەم شێوەیە بینیم کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەی کرد.

عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: «كان رسول الله صلى الله عليه وسلم إذا رمى جمر العقبة مضى ولم يقف». صحيح إبن ماجة (٢٤٥٩).

واتە: عبدالله ی کوڕی عباس دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك (جمرة العقبة)ی ڕەجم کرد ڕۆشت و نەوەستا (واتە بۆ دوعا کردن لە دوای دا).

* کاتی ڕەجم کردنی هەرسێ جەمرەکە لە ڕۆژانی سێهەمی کۆتایی جەژن دا لەدوای بانگی نیوەڕۆ بۆ ئێوارە ڕەجمی بکات، وە ئەگەر

نەیتوانی و خستییە شەو ئەوا دروستە: عن إبن عباس رضي الله عنهما: «الراعي يرمى بالليل ويرعى بالنهار». الصحيحة (٢٤٧٧).

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەی دا بە شوانی ئاژەڵانی قوربانی کە بەشەو ڕەجمی جەمەڕات بکەن.

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: «...وَقَالَ: رَمَيْتُ بَعْدَ مَا أَمْسَيْتُ، فَقَالَ: "لاَ حَرَجَ"». البخاري (١٧٣٥).

واتە: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ لەدوای ئێوارە ڕەجم کرد، فەرمووی: بیکە ڕێگری نییە.

* هەرسێ ڕۆژەی جەژن دەبێت ڕەجم کردنی جەمەڕات لەدوای بانگی نیوەڕۆوەیە، دروست نییە ڕەجم کردنەکان پێش بخات لە بەیانی یەوە بۆ پێش بانگی نیوەڕۆ بەپێی ئەم بەڵگانە:

١. پێغەمبەری خوا ﷺ وەستاوە تا بانگی نیوەڕۆی داوە (الزوال) پاشان ڕەجمی کردوون وە فەرموویەتی: «لتأخذوا عني مناسككم» ئێوە شێوازی کاری حەجم لێ وەرگرن.

**٢. ئەگەر دروست بوایە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی دەیکرد، وە هەموو کارێکی ئاسانی لە حەج دا ڕێ پێ داوە وەکو باسمان کرد، وە هیچ گێڕانەوەیەکمان نییە لەسەر ڕێ پێدانی.**

**عبدالله ی کوڕی عومەر دەڵێت: «كُنَّا نَتَحَيَّنُ فَإِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ رَمَيْنَا»**. البخاري (١٧٤٦).

**واتە: ئێمە چاوەڕێی زەوال (بانگی نیوەڕۆ)مان دەکرد، کە دەبوو ڕەجمی جەمەڕات مان دەکرد.**

**٣. پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ (الزوال) بووە، واتە ڕۆژ لە ناوەڕاستی ئاسمان لای داوە کەکاتی بانگی نیوەڕۆیە، نوێژی نیوەڕۆی نەکردووە ڕەجمی (جمرات)ی کردووە، تەنانەت پێش نوێژی خستووە، گەر دروست بوایە پێش بانگ خۆی دەیکرد یاخود ڕێگەی بە هاوەڵێکی دەدا بیکات.**

**٤. وە (بدیل) لەبریتیش مان هەیە ئەویش دەتوانێت لەدوای بانگی شێوان تا بەیانی بەشەو ئەنجامی بدات گەر لەبەر قەرەباڵغی یە یا هەرشتێکی تر هەیە، هەروەك پیاوێك ووتی (رميت بعدما أمسيت)، قال ﷺ: «لاَ حَرَجْ»**. البخاري (١٧٣٥).

واتە: ڕەجم کرد پاش ئێوارە، فەرمووی: ڕێگری نییە، وە «الراعي يرمى بالليل ويرعى بالنهار». الصحيحة (٢٤٧٧).شوانەکە بە ڕۆژ شوانی بکات وە شەو ڕەجمی جەمەڕات بکات.

* وە گەر کەسێك بە هۆکاری نەخۆشی یەوە یاخود نەزانینەوە نەیتوانی ڕۆژێکیان ڕەجمەکان ئەنجام بدات، ئەوا لە ڕۆژی داهاتوو دا، ڕەجم کردنی هەردوو ڕۆژەکە ئەنجام دەدات بە مەرجێك ڕەجمەکان بە جیاجیا بێت، واتە ڕەجم کردنی ڕۆژێك تەواو بکات پاشان بگەڕێتەوە سەر لەنوێ ڕەجم کردنی ڕۆژێکی تر ئەنجام بدات.

وە دەبێت ڕەجم کردنی یەکەم بۆ ڕۆژی خۆی بێت پاشان ڕەجم کردنی دووەم بۆ ڕۆژی ڕابوردوو بێت.

عَن عَاصِمِ بْنِ عَدِيّ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: «رَخَّصَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِرِعَاءِ الإِبِلِ فِي البَيْتُوتَةِ: أَنْ يَرْمُوا يَوْمَ النَّحْرِ، ثُمَّ يَجْمَعُوا رَمْيَ يَوْمَيْنِ بَعْدَ يَوْمِ النَّحْرِ فَيَرْمُونَهُ فِي أَحَدِهِمَا». صحيح أبي داود (١٩٧٥)، والترمذي (٧٦٣).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەی داوە بە شوانەکان بە شەو لە مینا دا نەمێننەوە و ڕەجم کردنی دوای یەکەم ڕۆژی جەژن کۆ بکەنەوە لە یەك ڕۆژ دا هەردووکی ئەنجام بدەن.

ئەم شێوازە باشترە وەك لەوەی كەسێك (وەكیل) بگرێت بۆ ئەم كارەو خۆی ئەنجامی نەدات.

* حاجی دەتوانێت شەوانی مینا سەردانی كەعبە بكات و تەواف و عیبادەت بكات تا نیوە شەو پاشان بگەڕێتەوە بۆ مینا، گرنگ ئەوەیە بەشێكی شەو لە مینا بكاتەوە گەر سەرەتای شەو بێت یاخود بەشی كۆتایی گەر لە نیوەی شەو كەمتر نەبێت باشترە.

عن إبن عباس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: «كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يزور البيت كل ليلة من ليالي منى». الصحيحة (٨٠٤).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو شەوانی مینا سەردانی كەعبەی دەكرد.

وە ئاگای لە بناغەی عیبادەتەكەی مینای بێت كە مانەوەی شەوو ڕەجمی جەمەراتە وە ئەگەری هەموو ڕوداوێك بكات لە چوونی بۆ كەعبە و گەڕانەوە كە زیان بگەیەنێت بە واجبەكانی لە پێناوی سوننەت دا، وەك عائیشەی خێزانی دەڵێت: «...ثم رجع إلى منى فأقام بها أيام التشريق الثلاث...». صحيح أبي داود (١٩٧٣)، وأحمد (٦/٩٠).

واتە: پاشان گەڕایەوە مینا و سێ ڕۆژەی بە مانەوە بەسەر كرد.

* باشترین شێوازی مانەوەی حاجییان لە مینا دا گەر گونجا نوێژەکانیان لە مزگەوتی (خیف) بکەن، کە شوێنی نوێژی پێغەمبەرانە علیهم الصلاة والسلام، قال رسول الله ﷺ: «صلى في مسجد الخيف سبعون نبيا». صحيح الترغيب (١١٢٧)، مناسك الحج للألباني ص٣٩.

واتە: حەفتا پێغەمبەر علیهم الصلاة والسلام لە مزگەوتی (خیف) نوێژیان کردووە.

* واجبە حاجییان دوو ڕۆژی جەژنی قوربان بێجگە لە ڕۆژی یەکەمی، واتە ڕۆژی دووەم و سێهەم لە مینا دا بمێنێتەوەو ڕەجمی جەمەرات بکات.

کەواتە ڕۆژی سێهەمی جەژن پێی دەوترێت (النفر الأول) دەرچوونی یەکەم، واتە حاجی دەتوانێت لەدوای ڕەجمی جەمەراتی ئەو ڕۆژە پێش خۆر ئاوا بوون سنوری مینا بەجێ بهێڵێت و کۆتایی بە حەجەکەی بهێنێت، وە دەتوانێت ڕۆژی چوارەم بمێنێتەوە.

قال تعالى: ﴿فَمَن تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ لِمَنِ ٱتَّقَىٰ﴾ [البقرة: ٢٠٣].

باشتر وایە حاجییان بمێننەوە بۆ چوارەم ڕۆژی جەژن تا ڕەجمی جەمەرات بکەن:

١. خوای پەروەردگار چوارەم ڕۆژی پەیوەست و باس کردووە بە زیاتر تەقواو خواپەرستی یەوە.

٢. پێغەمبەر ﷺ کام کار خواپەرستی تەواو بوبێت ئەو کارەی هەڵبژاردووە بۆیە لە چوارەم ڕۆژ دا ماوەتەوە: «...فأقام بها أيام التشريق الثلاث...».صحيح أبي داود (١٩٧٣)، وأحمد (٦/٩٠).

٣. کەسی سێهەم ڕۆژ زووتر کۆتایی بە مەراسیمی حەج دێنێت بەڵام کەسی چوارەم ڕۆژ زیاتر لەناو عیبادەتی حەج دا دەمێنێتەوە بە شەوو ڕۆژێك.

٤. مانەوە گونجاوتر لەگەڵ داواکاری پەروەردگار کە هەر چوار ڕۆژەکەی جەژن لە یاد و عیبادەتی خوا دا بن وە باشترینی بۆ ئەو ڕۆژانە(ڕەجم کردنی جەمەرات و الله أكبر)کردن لەگەڵی دا: ﴿وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡدُودَٰتٖ﴾ [البقرة: ٢٠٣].

# کۆتا کاری حاجی

# (طواف الوداع)

تەوافی ماڵئاوایی و بەجێ هێشتن واجبە لەسەر حاجییان لە حج دا لەسەر ڕای کۆی زانایان بۆ کەسێك بیەوێت لە مەککە دەرچێت و بگەڕێتەوە بێجگە لە ئافرەتان کە لە سوڕی مانگانەدا بن.

١. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: ((أُمِرَ النَّاسُ أَنْ يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِمْ بِالْبَيْتِ، إِلَّا أَنَّهُ خُفِّفَ عَنِ الحَائِضِ)). البخاري (١٥٥).

واتە: فەرمان درا بە خەڵکی کە کۆتا کاریان تەوافی ماڵی خوا بێت بیجگە لە ئافرەتان کە لە سوڕی مانگانە دان.

٢. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: ((كَانَ النَّاسُ يَنْصَرِفُونَ فِي كُلِّ وَجْهٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: "لَا يَنْفِرَنَّ أَحَدٌ حَتَّى يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِ بِالْبَيْتِ")). مسلم (١٣٢٧).

واتە: خەڵکی هەریەکەی بە شوێنێك دا دەڕۆیشتن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ کەسێك نەڕوات تا کۆتا کاری تەوافی ماڵی خوا نەبێت.

٣. عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، وَعُرْوَةَ، أَنَّ عَائِشَةَ قَالَتْ: «حَاضَتْ صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيّ بَعْدَ مَا أَفَاضَتْ،... َقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «أَحَابِسَتُنَا هِيَ؟» قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّهَا قَدْ كَانَتْ أَفَاضَتْ...فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: "فَلْتَنْفِرْ" )).البخاري (٣٢٨)، ومسلم (١٢١١).

واته: کاتێك صەفییەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ کەوتە سوڕی مانگانەوە فەرمووی: ئەوە بوو بەهۆی ڕێگریمان...وتیان تەوافی (الإفاضة)ی کردووە، فەرمووی: کەواتە با ڕێکەوین بۆ گەڕانەوە.

* گەر دوای تەوافی کۆتایی حاجی لە بازار دا شتومەکی کڕی یاخود مایەوە ماوەیەك هەرچەندە بێت بۆ چاوەڕێ کردنی قافڵەو هاوەڵانی مایەوە بە مەرجێك نییەتی مانەوەیان نەبێت، ئەوا دروستەو هیچ پێویست ناکات تەواف بکرێتەوە.

## چۆنێتی حەج کردن کۆتایی هات

# پلەو پاداشتی عومرە

١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «العُمْرَةُ إِلَى العُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا». البخاري (١٧٧٣)، ومسلم (١٣٤٩).

واتە: عومرە تا عومرەیەك سڕینەوەی نێوانیانە.

٢. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَابِعُوا بَيْنَ الحَجِّ وَالعُمْرَةِ، فَإِنَّهُمَا يَنْفِيَانِ الفَقْرَ وَالذُّنُوبَ كَمَا يَنْفِي الكِيرُ خَبَثَ الحَدِيدِ، وَالذَّهَبِ، وَالفِضَّةِ... ». الترمذي (٦٥٠)، الصحيحة (١٢٠٠)، النسائي (٢٤٦٧)، ابن ماجة (٢٣٣٤).

واتە: بەدوای یەكدا حەج و عومرە بكەن،هەردووكیان هۆكاری نەمانی هەژاری و تاوانە ،وەكو ئاگر كە پاككەرەوەی پیسی ئاسن و ئاڵتون و زیوە.

٣. عن ابن عمر رضي الله عنهما عن النبي ﷺ قال: «الغازى في سبيل الله و الحاج و المعتمر و فدُ الله : دعا هم فأجابوه و سألوه فأعطاهم». صحيح سنن ابن ماجة (٢٣٣١)، والنسائي (٢٤٦٥).

واتە: موجاهید و حاجی و عومرەكار نوێنەرن بۆ لای پەروەردگار بانگی كردن وەڵامیان دایەوە، چی داوا دەكەن پێیان دەبەخشێت.

٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «جِهَادُ الْكَبِيرِ، وَالصَّغِيرِ، وَالضَّعِيفِ، وَالْمَرْأَةِ: الْحَجُّ، وَالْعُمْرَةُ».صحيح سنن النسائي (٢٤٦٣)، صحيح الترغيب (١١٠٠).

واتە: جیهادی تەمەن گەورە و بچوك و ئافرەت، حەج و عومرەیە.

٥. عن أبى هريرة رضي الله عنه قال رسول الله ﷺ: «من خرج حاجاً فمات كُتِبَ لَهُ أجر الحاج إلى يوم القيامة ومن خرج معتمراً فمات كُتِبَ لَهُ أجر المعتمر إلى يوم القيامة».صحيح الترغيب (١١١٤).

واتە: كەسێك بچێت بۆ حەج و لە ڕێگادا بمرێت پاداشتی حەجی بۆ دەنوسرێت تا ڕۆژی دوایی، وە كەسێك بچێت بۆ عومرە و لە ڕێگادا بمرێت پاداشتی عومرەی بۆ دەنوسرێت تا ڕۆژی دوایی، واتە هەتا ڕۆژی دوایی هەر لە حەج و عومرەدان.

٦. عَنِ ابْنِ عَبَّاس رضي الله عنهما قَالَ: أن رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قال: «عُمْرَةً فِي رَمَضَانَ تَقْضِي حَجَّةً أَوْ حَجَّةً مَعِي».البخاري (١٨٦٣)، ومسلم (١٢٥٦).

واتە: عومرەیەك لە ڕەمەزان دا وەكو حەجێك وایـە لەگەڵ مندا كردبێتی.

# ڕوکنەکانی عومرە

١.  ئیحرام، واتە: نیەت و ووتنی (التلبية): لبيك اللهم بالعمرة.
٢.  تەوافی کەعبە.
٣.  سەعی نێوان سەفا و مەروە.

واتە: عومرە بە بێ ئەمانە هەڵدەوەشێتەوە

# واجبەکانی عومرە

١.  پۆشینی ئیحرام لـە میقاتەوە.
٢.  سەر تاشین یان کورت کردنەوە.

واتە: بەبێ ئەمانە عومرە ناتەواوە و بە (فدية) پڕ دەبێتەوە.

# سونەتەکانی عومرە

بێجگە لـە بەشەکانی ڕوکن و واجب چیتر باس دەکرێت سونەتن و بە نەکردنیان لـە پاداشت و تەواویی عومرەکە کەم دەبێتەوە، بەدەر لـە نەزانین و هەڵە و لـەبیرچوون.

• پێویستە موسوڵمان کە دەیەوێت عومرە بکات کاتێك دەگاتە میقات (ذوالحليفة) ئەم کارانە ئەنجام بدات:

### ١. خۆشۆردن (غسل):

خۆی بشوات وەکو چۆن بۆ غوسلە شەرعییەکان خۆی دەشوات، وە پێش خۆشۆردن پێویستیەکانی موو برین و نینۆك کردن ئەنجام بدات، لەبەر ئەوەی نەکەوێتە ناو قەدەغەکراوەکانی ئیحرامەوە.

* تەنانەت ئەو ئافرەتانەی لە وادەی سوڕی مانگانەدان یاخود لە دوای منداڵ بوون دان، واجبە خۆیان بشۆن و بەرگی ئیحرام بپۆشن و بەشداری هەموو جۆرەکانی مەراسیمی عومرە بن، بێجگە لە تەوافی کەعبە و سەعی سەفا و مەروە، ئەوانە دوای تەواو بونیان لە سوڕی مانگانە ئەنجام دەدەن، وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «الْحَائِضُ وَالنُّفَسَاءُ إِذَا أَتَتَا عَلَى الْوَقْتِ تَغْتَسِلَانِ، وَتُحْرِمَانِ وَتَقْضِيَانِ الْمَنَاسِكَ كُلَّهَا غَيْرَ الطَّوَافِ بِالْبَيْتِ». صحيح سنن أبي داود (١٥٣٤) الترمذي (٧٥٤).

## ٢. پۆشینی ئیحرام:

پیاوان دەبێت هەموو بەرگێك لە خۆیان دامالّن، هیچ پارچە پۆشاکێکیان پێوە نەمێنێت بێجگە لەو دوو پارچە پۆشاکەی کە پێی دەوترێت (ئیحرام).

* ئافرەتان بۆیان هەیە هەموو جۆرە پۆشاکێك بپۆشن لە جۆر و ڕەنگ، بێجگە لە دەستکێش و نیقاب نەبێت وە هەرپارچەیەك کە دەم و چاوی پێ هەڵبپێچرێت، بەڵام ئەگەر پارچە قوماشێك لەسەریەوە دایباتەوە بەسەر دەم و چاوی دا بەبێ هەڵپێچان دروستە.

* بەرگی ئیحرامی پیاوان و ئافرەتان نابێت هیچ جۆرە بۆنێکی پێوەبێت.

* دوای پۆشینی ئیحرام قەدەغەیە پیاوان سەریان داپۆشن بە کڵاو و جامانە و هەرپارچەیەکی تر بێت، یاخود گۆرەوی و خوف و پێڵاو لەپێ بکەن بێجگە لە نەعل نەبێت، وە دەبێت شانی ڕاستیشی داپۆشێت: قَالَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: «لاَ يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ القَمِيصَ، وَلاَ العِمَامَةَ، وَلاَ السَّرَاوِيلَ، وَلاَ البُرْنُسَ، وَلاَ ثَوْبًا مَسَّهُ زَعْفَرَانٌ وَلاَ وَرْسٌ، وَلاَ الخُفَّيْنِ إِلَّا لِمَنْ لَمْ يَجِدِ النَّعْلَيْنِ،...». البخاري (١٥٤٢)، ومسلم (١١٧٧).، «وَلاَ تَنْتَقِبِ الْمَرْأَةُ الْمُحْرِمَةُ، وَلاَ تَلْبَسِ الْقُفَّازَيْنِ». البخاري (١٨٣٨).

* بە پۆشینی بەرگی ئیحرام ناچێتە ناو مەراسیمی (عبادة) عومرە تاوەکو بە زمان نەڵێت (لبيك اللهم بالعمرة) خودایە ئامادەم عومرە بۆ تۆ بکەم، واتە پێش ووتنی ئەمە ئەگەر پەشیمان بێتەوە لە عومرەکردن بە هیچ جۆرێك تاوانبار نابێت و فدیەی لەسەر ناکەوێت.

# التلبية

دەتوانرێت دوای پۆشینی ئیحرام و (التلبية) کە پێی داخل ئەبیتە ناو عومرە، عومرەکار خۆی بشوات و بەرگی ئیحرام بگۆڕێت و سەری شانە بکات بێجگە لە نینۆك کردن و موو لێکردنەوە و بۆنی خۆش لەخۆدان و نزیك بوونەوە لە خێزان نەبێت کە ئەمانە هەمووی لە قەدەغەکراوەکانی ئیحرامن.

ئەگەر یەکێك گومانی هەبوو لە تەواو کردنی عومرەکەی بەهۆی نەخۆشی و ڕووداوێکەوە، دەتوانێت لەکاتی ووتنی (التلبية) مەرج دابنێت و بڵێ (ئامادەم پەروەردگار عومرە بکەم بەمەرجێك هەرکاتێك هۆکارێکی ڕێگر هەبوو دەرچم لە ئیحرام)، ئەوا ئەگەر بۆی تەواو نەکرا تاوانبار نابێت و فدیەی لەسەر ناکەوێت وەك لەم فەرموودەیەدا

هاتووە: عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا ، قَالَتْ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى ضُبَاعَةَ بِنْتِ الزُّبَيْرِ، فَقَالَ لَهَا: «لَعَلَّكِ أَرَدْتِ الحَجَّ؟» قَالَتْ: وَاللَّهِ لاَ أَجِدُنِي إِلَّا وَجِعَةً، فَقَالَ لَهَا: " حُجِّي وَاشْتَرِطِي، وَقُولِي: اللَّهُمَّ مَحِلِّي حَيْثُ حَبَسْتَنِي". البخاري (٥٠٨٩)، ومسلم (١٢٠٧).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ لای زوباعەی کچی زوبێر و فەرمووی: ڕەنگە ویستی حەجت بوو بێت، وتی: بەردەوام نەخۆشم و ئازارم هەیە، فەرمووی: حەج بکە و بە مەرجی بگرە و بڵێ: ئامادەم حەج بکەم بە مەرجێك هەر ڕێگرێك هەبوو دەرچم لە ئیحرام.

* دەتوانرێت پۆشاکی ئیحرام بپۆشرێت پێش (میقات) کە (ذو الحليفة)یە پێی دەڵێن (أبيار علي) بە مەرجێك، نابێت تا دەگەنە میقات نیەت و ووتنی (التلبية) بێنن.

تاوەکو (التلبية) نەڵێن ناچنە ناو مەناسیکی عومرەوە، لەبەرکردنی ئیحرام وەك دەستنوێژ گرتن وایە بۆ نوێژ وە ووتنی (التلبية) وەکو (الله أكبر)ی دابەستنی نوێژ وایە.

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا ، قَالَ: «انْطَلَقَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ المَدِينَةِ بَعْدَ مَا تَرَجَّلَ، وَادَّهَنَ وَلَبِسَ إِزَارَهُ وَرِدَاءَهُ هُوَ وَأَصْحَابُهُ». البخاري (١٥٤٥).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە دەرچوو لەگەڵ هاوەڵەکانیدا پاش لەبەرکردنی ئیحرام و قژ داهێنان و چەورکردنی.

* نوێژی سونەتی پاش پۆشینی ئیحرام، وەکو سونەت هیچ فەرموودەیەکی لەسەر نەهاتووە، بەڵام دەتوانرێت دوو ڕکاتی دەستنوێژ بێت یاخود چوونە مزگەوت بێت، یان هەر سونەتێکی تر بێت لە مزگەوتەکەی (ذو الحليفة) بکەیت و بەڵکو نوێژ کردن لە میقاتی (ذو الحليفة) سونەتە و شوێنێکی بەبەرەکەتە وەك لەم فەرموودانەدا هاتووە:

عَنْ عُمَرَ رضي الله عنه، يَقُولُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ بِوَادِي العَقِيقِ يَقُولُ: «أَتَانِي اللَّيْلَةَ آتٍ مِنْ رَبِّي، فَقَالَ: صَلِّ فِي هَذَا الوَادِي المُبَارَكِ». البخاري (١٥٣٤).

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب خوای لێ ڕازی بێت ووتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەمشەو نێردراوێك لای پەروەردگارمەوە هات و ووتی نوێژ لەم شیوە بەڕێز و بەرەکەت دارەدا بکە.

عن ابن عمر رضي الله عنهما قيل له: «إِنَّكَ بِبَطْحَاءَ مُبَارَكَةٍ». البخاری (١٥٣٥).

واتە: تۆ لە شوێنێکی تەختایی بەبەرەکەت دایت.

وفِي رواية: «كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَرْكَعُ بِذِي الْحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْن». مسلم (١١٨٤).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات نوێژی لە (ذو الحليفة) میقات کرد.

* پاش نوێژەکە هەر لە سنووری مزگەوتی (ذو الحليفة) دا ڕوو بکەرە قیبلە و بڵێ (لبيك اللهَّم بالعمرة)، (لا رياء فيها ولا سمعة) ئامادەم پەروەردگار عومرە بکەم بە بێ ڕیا و دەربڕین.

* لەدوای وتنی ئەمەی پێشوو دەچێتە ناو مەراسیمی عومرەوە، واجبە بەردەوام بوون لەسەر ووتنی (التلبية) بە گوێرەی توانا و تێکەڵکردنی زیکر و نزا و قورئان خوێندن لە نێوانیاندا، بەمەرجێك هەر یەکێك بۆ خۆی بیکات بە دەنگی بەرز، (التلبية)ش بریتیە لە «لَبيكَ اللهَّم لَبيك، لَبيكَ لا شَريكَ لّكَّ لّبّيك، إِنَّ الحَمْدَ وّ النِعْمَةَ لَكَ وَالُملك، لا شَريكَ لَك».

واتە: ئامادەم خوای پەروەردگار ئامادەم، هیچ هاوەڵ و شەریکێکت نییە و هەموو سوپاس و ستایش و نیعمەتێك بۆ تۆیە لەگەڵ هەموو موڵك و بونێکدا، هیچ هاوەڵ و شەریکێکت نییە.

دەبێت ئەم زیکرە کە شیعاری عومرە و حەجە، زۆر و بەردەوام زیکری سەر زوبانی بێت تا دەگاتە (مەککە) یاخود بەردەم (حجر الأسود).

* دەتوانرێت ئەم جۆرانەش تێکەڵی (التلبية) بکرێت:

١. «لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ، وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ بِيَدَيْكَ، لَبَّيْكَ وَالرَّغْبَاءُ إِلَيْكَ وَالْعَمَلُ». البخاري (١٥٤٩)، ومسلم (١١٨٤).

٢. «لَبَّيْكَ إِلَهَ الْحَقِّ». صحيح سنن النسائي (٢٥٧٩).

٣. «لَبَّيْكَ ذَا الْمَعَارِجِ، وَلَبَّيْكَ ذَا الْفَوَاضِلِ». أبوداود (١٥٩٠)، السنن الكبرى للبيهقي (٩٠٣٢).

سوننەتە ئەم زیکرانە هەر یەکە بۆ خۆی بیکات بە دەنگی بەرز، بە بەڵگەی ئەم فەرموودانە:

١. «أَتَانِي جِبْرِيلُ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَمَرَنِي أَنْ آمُرَ أَصْحَابِي وَمَنْ مَعِي أَنْ يَرْفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ بِالتَّلْبِيَةِ». صحيح أبي داود (١٥٩٢).

واتە: جبریل سەلامی خوای لێبێت هات بۆ لام و فەرمانی پێدام فەرمان بدەم بە هاوەڵانم و ئەوانەی لەگەڵمن دەنگ بەرزکەنەوە بە (التلبية).

٢. «أفضل الحجّ و العجُّ و الثجُّ». صحيح الجامع الصغير (١١١٢).

واتە: باشترین (حەج، العجُّ)، واتە دەنگ بەرزکردنەوەیە بە (التلبية)، وە الثجُّ: خوشەی خوێن ڕشتنی قوربانییە.

٣. ((ما من مُلبي يلبي الا لبّى ما عن يمينه و عن شماله من شجر و حجر حتى تنقطع الارض من هنا و هنا)). صحيح الترغيب (١١٨/٢).

واتە: هەر کەسێك (التلبية) بڵێت هیچ شتێك نییە لای ڕاستی و چەپی لە درەخت و بەرد و هەرچی لەملا و لەولایدایە هەموو وەکو ئەو (التلبية) دەڵێنەوە.

٤. ((كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَامُ هَابِطًا مِنَ الثَّنِيَّةِ، وَلَهُ جُؤَارٌ إِلَى اللهِ بِالتَّلْبِيَةِ)). البخاري (٣٣٥٥)، ومسلم (١٦٦).

واتە: هەروەك ببینم موسا سەلامی خوای لێبێت لەسەر تەپۆلکەیەك دێتە خوارەوە و بە دەنگی بەرز (التلبية) دەڵێت.

وەك (ئەبو حازم) دەفەرموێت: (هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە بە دەنگی بەرز دەیانوتەوە نەدەگەیشتنە مەککە دەنگیان دەنوسا). رواة ابن شبية الفتح (٣٣٢٤)، وسعيب بن منصور ( ٧/٩٤).

ئافرەتان دەبێت ئەوەندەی کە خۆیان و هاوەڵانیان ببیستن دەنگ بەرز بکەنەوە.

### ٣. چۆنیەتی چوونە ناو مزگەوتی (حەرەم):

**پێویستە ڕەچاوی ئەم شێوازانەی خوارەوە بکرێت:**

بێگومان حەرامە و نابێت ئافرەتان کە لـە سوڕی مانگانەدان بچنە ناو مزگەوتی حەرەم و تەواف ئەنجام بدەن، هەروەك پێغەمبەر ﷺ بە عائیشەی خێزانی فەرموو: ((**فَاقْضِي مَا يَقْضِي الْحَاجُّ، غَيْرَ أَنْ لَا تَطُوفِي بِالْبَيْتِ حَتَّى تَغْتَسِلِي**)).البخاري (٢٩٤)، ومسلم (١٢١١).

واتە: دەبێت هەموو کارێك کە حاجی دەیکات ئەنجامی بدەیت (لـە خۆشۆردن و ئیحرام و تەلبیە) بێجگە لـە تەواف نەبێت هەتا خۆت دەشۆیت (واتە تەواو دەبیت).

قاچی ڕاستت پێش بخە و بڵێ: ((**فَلْيُسَلِّمْ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ**)).أبو داود (٤٦٥)، وإبن ماجة (٧٧٢).

بسم الله بکە و سڵاوات لـە پێغەمبەر ﷺ بدە و بڵێ: پەروەردگار دەرگای بەزەیی خۆتم بۆ بکەیتەوە.

**یاخود ئەم زیکرە بکە:**

((**أَعُوذُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ، وَبِوَجْهِهِ الْكَرِيمِ، وَسُلْطَانِهِ الْقَدِيمِ، مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ**)).أبو داود (٤٤١).

ئەگەر كەعبەت لێدەركەوت بوەستە و هەردوو دەستت هەڵبڕە و ڕووە و كەعبە دوعا بكە، وە ئەگەر دوعاكەی عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ بكەیت باشترە: «اللهُّم أَنت السلام و منك السلام فحّينا ربّنا بالسلام». مناسك الحج للألباني ص ٢٠.

واتە: خوای پەروەردگار تۆ ناوت سەلامە و سەلامەتی هەر لای تۆوەیە، بمان ژیێنە بە سەلامەتی.

بەم شێوەیە ئیمامی عومەر و عبدالله ی كوڕی عباس ﷺ دەستیان بەرز كردوتەوە و دوعایان كردووە لەكاتی بینینی كەعبەدا.

# تەوافی كەعبە

بەرەو (حجر الأسود) دەڕۆیت تا دەگەیتە بەردەمی، كاتێك گەیشتیتە بەردەم (حجر الأسود) لەسەر ڕای عبدالله ی كوڕی عباس ﷺ كۆتایی بە (التلبیة) دێت، وە پاشان دەست دەكەیت بەم كارانە:

* شانی ڕاستت دەردەخەیت.

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَأَصْحَابَهُ «اعْتَمَرُوا مِنَ الْجِعْرَانَةِ فَرَمَلُوا بِالْبَيْتِ وَجَعَلُوا أَرْدِيَتَهُمْ تَحْتَ آبَاطِهِمْ قَدْ قَذَفُوهَا عَلَى عَوَاتِقِهِمُ الْيُسْرَى». صحيح سنن أبي داود (١٦٥٩) .

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی کە عومرەیان کرد ئیحرامەکانیان دا بەسەر شانی چەپیاندا و شانی ڕاستیان دەرخست.

دەبێت هەر حەوت تەوافەکە شانی ڕاستت دەرکەوێت و دانەپۆشرێت، هەروەك (ابن يعلى) لە باوکیەوە دەیگێڕێتەوە «أَنَّ النَبيَ صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ طَافَ بِالبَيتِ مُضطبعاً». صحيح سنن الترمذي (٦٨٢).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی بە ماڵی خوادا بە شان ڕووت کراوی بوو، واتە (هەر حەوت تەوافەکە)، ئەمە بەرپەرچ دانەوەی ئەو قسەیە کە دەڵێن دەبێت لەدوای سێ تەوافی هەروەلەکەی کەعبە شان داپۆشرێت، لەبەر ئەوەی هەروەلە تەواو بوو شان داپۆشینیش تەواو بوو. بڕوانە حجة النبي ﷺ للألباني ص٥٨.

* بەرەو (حجر الأسود) برۆ ئەگەر گونجا و بۆت ڕەخسا دەستی لێ بدە و ماچی بکە و سوجدەی لەسەر ببە.

عَنْ إبن عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: ((يَسْتَلِمُ الْحَجَرَ بِيَدِهِ، ثُمَّ قَبَّلَ يَدَهُ، وَقَالَ: مَا تَرَكْتُهُ مُنْذُ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَفْعَلُه)). مسلم (١٢٦٨).

واتە: عبداللە ی کوڕی عومەر رَضِيَ اللهُ عَنْهُ دەستی دەدا لە (حجر الأسود) و ماچی دەکرد و دەیوت وازم لێنەهێناوە لەو کاتەی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ م بینیوە کردوویەتی، وە ئیمامی عومەر و عبداللە ی کوڕی عباس رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ سوجدەیان لەسەر بردووە. الإرواء (١١١٢).

ئەگەر نەڕەخسا ماچی بکەیت، دەستی لێبدە و دەستت ماچ بکە، ئەگەر ئەوەشت بۆ نەکرا ئەوا دەستی ڕاستت هەڵبڕە و هەموو ڕووی جەستەتی تێبکە وەك سلام لێکردنی و بڵێ (بسم الله الله أكبر) یاخود هەر (الله أكبر).

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: ((أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، كَانَ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ عَلَى رَاحِلَتِهِ، فَإِذَا انْتَهَى إِلَى الرُّكْنِ أَشَارَ إِلَيْهِ)). صحيح سنن النسائي(٢٩٥٥).

عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: ((طَافَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْبَيْتِ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ عَلَى رَاحِلَتِهِ يَسْتَلِمُ الْحَجَرَ بِمِحْجَنِهِ)). مسلم (١٢٧٣).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجی ماڵئاوایی دا تەوافی کرد بەسەر حوشترەکەیەوە و بەسەری گۆچانەکەی دەیدا لە (حجر الأسود) و ماچی ئەکرد.

پێغەمبەری خوا ﷺ بە عومەری کوڕی خەتتابی فەرموو: «ئەی عومەر تۆ پیاوێکی بەهێزی ئازاری لاواز مەدە، ئەگەر چۆڵ بوو ئەوا دەستی لێ بدە، وە ئەگەر نا ڕووی تێبکە و "الله أكبر" بکە»، «وإلا فاستقبله و كَبِّر». الترمذي و إبن خزيمة و البيهقي (٥/٨٠).

وە عبدالله ی کوڕی عومەریش لە کاتی (حجر الأسود) دا دەیوت: «بسم الله، الله أكبر». عبدالرزاق (٨٨٩٤)، والبيهقي (٥/٧٩).

وە عبدالله کوڕی عباس دەفەرموێ: «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَافَ بِالْبَيْتِ وَهُوَ عَلَى بَعِيرٍ، كُلَّمَا أَتَى عَلَى الرُّكْنِ أَشَارَ إِلَيْهِ بِشَيْءٍ فِي يَدِهِ، وَكَبَّرَ». البخاري (١٦١٣).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی ئەکرد و هەرکاتێك بگەیشتایەتە ئاستی (حجر الأسود) ئیشارەتی ئەکرد بە شتێ بە دەستیەوە بووە و (الله أكبر)ی دەکرد.

